# سیفاتە بەرز و پیرۆزەکان

## بە بەڵگەی ئایەت و فەرموودەکان



نوسینی
**داستان محمد**

ئامادەکردنی
**أحمد هاشم**

﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ ۚ
سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾

[الزُّمَر: ٦٧]

# ناوەڕۆک

گومان لەوەدا نییە کە بەسوودترین و چاکترین زانست زانستی (تەوحید)ە، وەکوو وتراوە:
(أفضل العلوم علم التوحيد، وأنفع العلوم علم الفقه)، لەبەر پەیوەستی ئەو زانستە بەخواوە، وە لەناو (تەوحید)یشدا لەخۆگری هەرسێ بوارەکەی (تەوحید) کە (الربوبية، الالوهية، الاسماء والصفات) یەکێک لەو بنچینانەی تەوحید(الاسماء والصفات)ە، واتا: ناوە جوان و سیفاتە پیرۆزەکانی الله، بۆیە (صفات) پیرۆزترین زانستە، چونکە ناسینی پەروەردگارە، بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە.



## سیفەتی ﴿السرعة﴾

### بەڵگە لە قورئان:

قال الله تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ [المائدة: ٤]

قال الله تعالى: ﴿إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ﴾ [الأنعام: ١٦٥]

### بەڵگە لە فەرموودە:

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: (كُنْتُ أَغَارُ عَلَى اللَّاتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَقُولُ: أَتَهَبُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا ؟ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: تُرْجِئُ مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُئْوِي إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ. قُلْتُ: مَا أُرَى رَبَّكَ إِلَّا يُسَارِعُ فِي هَوَاكَ).

**[صحيح البخاري: ٤٧٨٨]**

**[صحيح مسلم: ١٤٦٤]**

واتا:

عائشة رضي الله عنها دەفەرمووێ: (من غیرەم لەو ئافرەتانە دەکرد کاتێ دەهاتن خۆیان پێشکەش بە پێغەمبەری خوا دەکرد صلى الله عليه وسلم، منیش دەمگوت ئایا ئافرەت شەرم ناکات بۆ مارەیی خۆی پێشکەش دەکات ؟

تا کاتی ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە؛

قال الله تعالى: ﴿تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَ﴾

ئەو ئافرەتانەی کە خۆیانت پێشکەش دەکەن ئەوەی ویستت لێ بێت دوای دەخەی و رەتی دەکەیتەوەو ناتەوێت، وە ئەوەیشی کە ویستت لێ بێت پێشی ئەخەی و دەتەوێت و دەیگریتە خۆت، بە ویستی خۆتە کامەیان ئەهێنی و

کامەیان ناهێنێ ﴿وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ﴾ وە ئەوەی کە ویستووتەو ئەوەی کە نەتوویستووە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ هیچ تاوانێکت لەسەر نییە.

عائشة دواتر وتی: دەبینم خوای پەروەردگار خێرایە لە فراوانکردنی کارەکانت و هەموو شتێکت بۆ فەراهەم دەکات بە ئاسانی).

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی (٢٠٢)ی سورەتی البقرة دەڵێ:

الله **جل ثناؤه** وەسفی خۆی کرد بە خێرایی حیساب کردن، چونکە الله **جل ذکره** کردەوەی بەندەکانی ئەژمێرێ بەبێ بەکارهێنانی پەنجە و بیرکردنەوە و لێ وورد بوونەوە وەک ئەوەی دروستکراوە بێ توانا و لاوازەکانی دەیکەن، بەڵکو ئەو هیچ شتێکی لێ وون نابێت لە زەوی و لە ئاسمان، بە قەدەر مسقالە زەررەیەک شتی لێ شاراوە نیە لە زەوی و ئاسماندا، پاشان پاداشتی بەندەکانی ئەداتەوە لەسەر هەموو ئەمانە بۆیە **جل ذکره** مەدحی خۆی کردووە بە خێرایی حیساب کردن.

هەروها لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ [غافر: ١٧]

**الطبري** دەڵێ:

الله خاوەنی خێراییە لە موحاسەبە کردنی بەندەکانی لەو رۆژەدا لەسەر کردەوەکانیان کە ئەنجامیانداوە لە دونیادا.

**ابن منده** لە کتێبی (التوحید: ٢/١٣٧)

(**السريع**)ی بە یەکێک لەناوەکانی الله **تعالى** ژماردووە، ئەمەش جێگای تیڕامانە کە السریع بکرێت بەناو، بەڵام مادام بەناو هەژماری کردووە کەواتە بە دڵنیاییەوە (السرعة)ی بە صیفەتی الله **تعالى** داناوە، هەروەک لە

نامیلکەی قاعیدەکانی سیفات باسمان کردووە هەموو ناوێکی الله سیفەتێک لەخۆ ئەگرێت بەڵام پێچەوانەکەی نابێت بووترێ هەموو سیفەتێک ناوێک لەخۆ ئەگرێت.

## سیفەتی ﴿الأنامل﴾

(واتا: سەرە پەنجە)

**بەڵگە لە فەرمووده:**

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:

(إِنِّي قُمْتُ مِنَ اللَّيْلِ فَتَوَضَّأْتُ وَصَلَّيْتُ مَا قُدِّرَ لِي، فَنَعَسْتُ فِي صَلَاتِي فَاسْتَثْقَلْتُ،

فَإِذَا أَنَا بِرَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، فَقَالَ : يَا مُحَمَّدُ، قُلْتُ : لَبَّيْكَ رَبِّ، قَالَ : فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلَأُ الْأَعْلَى ؟ قُلْتُ : لَا أَدْرِي رَبِّ – قَالَهَا ثَلَاثًا – قَالَ : فَرَأَيْتُهُ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ أَنَامِلِهِ بَيْنَ ثَدْيَيَّ ...) الحديث.

**[مسند أحمد : ٢٢١٠٩]**

**[جامع الترمذي : ٣٢٣٥] واللفظ له**

**وفي رواية أحمد: وجدت برد أنامله بين صدري.**

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕۆژێکیان دوا ئەکەوێ بۆ نوێژی بەیانی ئینجا بە پەلە دێت نوێژەکەیان بۆ ئەکات و نوێژەکە بە کورتی ئەنجام ئەدات، ئینجا بە هاوەڵان ئەفەرمووێ: ئەزانن بۆ دواکەوتم ؟ ئەمشەو هەڵسام شەونوێژم کرد جا ئەوەندەی الله قەدەری وابوو کردم، پاشان خەو منی بردەوە، جا لە خەوندا (پەروەردگارم بینی **عز وجل** لە جوانترین شێوەدا، فەرمووی: ئەی محمد فریشتەکان دەربارەی چی قسە و گفتوگۆ ئەکەن ؟ ووتم: نازانم پەروەردگارم، فەرمووی: ئەی محمد فریشتەکان دەربارەی چی گفتوگۆ ئەکەن ؟ ووتم: نازانم پەروەردگارم، فەرمووی: ئەی محمد فریشتەکان دەربارەی چی گفتوگۆ ئەکەن ؟ ووتم: نازانم پەروەردگارم، جا بینیم ناوەوەی دەستی خستە نێوانی شانەکانم تاکو هەستم بە ساردی سەرە پەنجەکانی کرد لەنێوان مەمکەکانم).

ئەمە لەفزی الترمذي بوو، لە ریوایەتی أحمد ئەفەرمووێ: هەستم بە ساردی سەرە پەنجەکانی کرد لەنێوان سینگم.

**الترمذي** دەڵێ:

هذا حديث حسن صحيح، وە پرسيارم لە البخاري كرد دەربارەی ئەم فەرموودەيە، البخاري ووتی: هذا حديث حسن صحيح.

ووتم: خەونی پێغەمبەران وەحيە هەر بۆيە ئيسباتی ئەم سيفەتە ئەكەين بۆ الله **تعالی** هەروەک ئەوەی بە وەحی بۆی دابەزی بێت.

## سیفەتی ﴿الزارع﴾

### بەڵگە لە قورئان:

قال الله تعالى: ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ (٦٣) ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ (٦٤)﴾ [الواقعة: ٦٣, ٦٤]

واتا:

ئایا ئەو زەوییەی کە دەیکێڵن و تۆی بەسەردا ئەکەن ئێوە ئەیچێنن و دەری ئەهێنن لە زەوی یان ئێمە ئەیچێنین و دەری ئەهێنین لە زەوی.

**القرطبي** لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ:

زەوی کێڵانی دایە پاڵ ئەوان و چاندن و دەرهێنانی دایە پاڵ خۆی، چونکە زەوی کێڵان کرداری مرۆڤەکانە و لەسەر ویستی خۆیانە، وە زەرع کرداری الله **تعالى** یە و لەسەر ویستی الله دێتە دەرەوە نەک لەسەر ویستی ئەوان.

ووتم: الزارع سیفەتی الله یە ناوی الله نیە.

# سیفەتی ﴿استطابة الروائح﴾

(واتا: بە خۆش دانانی بۆن)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

پیغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ).

**[صحیح البخاري: ١٨٩٤]**

**[صحیح مسلم: ١١٥١]**

واتا:

سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، گۆڕانی بۆنی دەمی کەسی بەڕۆژوو بوو لەلای الله خۆشترە لە بۆنی میسك.

**ابن القیم** دەڵێ:

مەعلومە خۆشترین بۆن لەلای مرۆڤ بۆنی میسکە، جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گۆڕانی بۆنی دەمی کەسی بەڕۆژوو بووی لەلای الله وەک خۆشی بۆنی میسك بە نسبەت ئێمە چواندووە بگرە خۆشیەکەی زیاترە لای الله، بەخۆش دانانی بۆنیش کە بدرێتە پاڵ الله **سبحانه وتعالى** وەک دانە پاڵی باقی سیفەتەکان و کردارەکانی تریەتی، چونکە بە خۆش دانانێکە کە وەک بە خۆش دانانی مەخلوقات نیە، هەروەک چۆن رازی بوون و تورە بوون رق لێ بوون و خۆشویستنی وەک هی مەخلوقات نیە، وە ئەو بە خۆش دانانەی الله وەک بە خۆش دانانی ئێمە نیە، دواتر تەئویل کردنی ئەم سیفەتە کێشەکە لانادات، چونکە ئەوانەی ئیسبات کردنی ئەم سیفەتە بە کێشە ئەزانن ئەوا مولزەم دەبن بەوەی سیفەتی رازی بوون بە هەمان شێوە بە کێشە بزانن، جا گەر بڵێ: رازی بوونی الله وەک رازی بوونی مەخلوقات نیە، ئەوا ئێوەش بڵێن: بە خۆش دانانی ئەو وەک بە خۆش دانانی مەخلوقات نیە، جا بەم شێوەیە هەر سیفەتێک بێت ئاوا ئیسباتی دەکەین.

**[الوابل الصیب : ١/٥٢]**

**پرسیار:**

ئایا ئیسبات کردنی ئەوەی کە اللە بۆنی دەمی کەسی بە ڕۆژوو بوو بە خۆشتر ئەزانێت لە بۆنی میسك مانای ئەوەیە کە اللە سیفەتی بۆن کردنی هەیە یان لوتی هەیە ؟

**وەڵام:**

نەخێر، هەروەک لە قاعیدەکانی سیفات باسمان کردووە نابێ زاتی اللە بە زاتی مەخلوقاتەکانی بچوێنین، بەهەمان شێوەش نابێ سیفەتەکانی اللە بە سیفەتەکانی مەخلوقات بچوێنین، کە ئەڵێین: مرۆڤ بۆنی میسکی بەلاوە خۆشە، واتای ئەوەیە کە مرۆڤ سیفەتی بۆن کردنی هەیە، وە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ لوتی هەیە چونکە لەڕێگای لووتەوە بۆن دەکات، بەڵام ئەمە بۆ اللە **تعالی** وانیە، سیفەتەکانی تەوقیفین لەسەر بەڵگەی قورئان و سوننەت وەستاون، ئەڵێین: اللە **تعالی** بۆنی دەمی ڕۆژووان بە خۆش دادەنێت هەروەک لەم فەرموودەیە هاتووە، بەڵام ناڵێین اللە سیفەتی بۆن کردنی هەیە، وە ناڵێین اللە لوتی هەیە لە ڕێگای لوتەوە بۆن دەکات، چونکە سیفەتی بۆن کردن و سیفەتی لوت نە لە قورئان و نە لە سوننەت نەهاتوون، ئێمەش نە ئیسباتی دەکەین و نە نەفی دەکەین.

## سیفەتی ﴿الاطلاع﴾

(واتا: دەرکەوتن لە بەرزییەوە)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە ڕووداوەکەی حاطب بن أبي بلتعة بە ئیمامی عمر-ی فەرموو: (إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَكُونَ قَدِ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ : اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ).

**[صحيح البخاري: ٣٠٠٧]**

**[صحيح مسلم: ٢٤٩٤]**

واتا:

**حاطب بن أبي بلتعة** ئامادەی جەنگی بەدر بووە، تۆ چوزانی ڕەنگە الله لە بەرزیەوە دەرکەوتبێ بۆ ئەهلی بەدر فەرموبێتی: چیتان دەوێ بیکەن من لێتان خۆش بووم.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يُجْمَعُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَطْلُعُ عَلَيْهِمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ).

**[مسند أحمد : ٨٨١٧]**

**[جامع الترمذي : ٢٥٥٧]**

**قال الترمذي: حديث حسن**

**وصححه ابن تيمية في مجموع الفتاوى**

واتا:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خەڵکی کۆ دەکرێنەوە لە ڕۆژی قیامەت لەسەر یەک زەویدا، پاشان رب **العالمين** لە بەرزیەوە بۆیان دەردەکەوێ).

**تێبینی:**

لە فەرموودەی دووەم ووشەی (**یطلع**) سێ جار هاتووە، جارێک بۆ هەموو خەڵکی، دوو جاریش تەنها بۆ موسڵمانان، بەڵام لەبەر درێژ نەبوونەوە تەنها بەشی یەکەمم نوسیوە.

**الفيروزآبادي** دەڵێ:

الاطلاع: البدو والظهور من علو.

**[القاموس المحيط: مادة / طلع]**

واتا: الاطلاع: دەرکەوتنە لە بەرزییەوە.

(**وكل بأدلك من علو فقد طلع عليك**).

**بڕوانە:**

**[جمهرة اللغة: ٢/٩١٥]**

**[المخصص: ٤/٩٣]**

**[لسان العرب: ٨/٢٣٦]**

واتا: هەر شتێک لە بەرزیەوە بۆت دەرکەوێ ئەوا طلوعی کردووە بۆت.

ووتم: هەر بۆیە (طلعت الشمس) چونکە خۆر لە بەرزیەوە لێمان دەرئەکەوێ.

## سیفەتی ﴿الدلیل﴾

(واتا: ڕێنموونی)

### بەڵگە لە قورئان

قال الله تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ [الصف: ١٠]

واتا

ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ئایا ڕێنموونیتان بکەم بۆ بازرگانیەک کە لە سزای بە ئازاری دۆزەخ ڕزگارتان ئەکات.

### بەڵگە لە فەرموودە:

عَنْ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّهُ بَيْنَمَا مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ فِي قَوْمِهِ يُذَكِّرُهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ – وَأَيَّامُ اللَّهِ نَعْمَاؤُهُ وَبَلَاؤُهُ – إِذْ قَالَ: مَا أَعْلَمُ فِي الْأَرْضِ رَجُلًا خَيْرًا، وَأَعْلَمَ مِنِّي. قَالَ: فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: إِنِّي أَعْلَمُ بِالْخَيْرِ مِنْهُ -أَوْ عِنْدَ مَنْ هُوَ- إِنَّ فِي الْأَرْضِ رَجُلًا هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ. قَالَ : يَا رَبِّ فَدُلَّنِي عَلَيْهِ).

**[صحيح مسلم : ٢٣٨٠]**

واتا:

أبي بن كعب دەڵێ:

بیستم پێغەمبەری الله صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو:

کاتیك موسی علیه السلام لەناو قەومەکەیدا ڕۆژەکانی الله-ی بیردەخستنەوە – وە ڕۆژەکانی الله بریتیە لە نیعمەتەکانی و تاقیکردنەوەکانی – کاتێک موسی ووتی: نازانم لە زەویدا کەسێک هەبێت چاکتر و زاناتر بێت لە من، جا الله وەحی بۆ نارد پێی ڕاگەیاند کە الله دەزانێت کەسێک هەیە لە موسی چاکترە، لە زەویدا پیاوێک هەیە لە تۆ زاناترە، موسی ووتی: (ئەی پەروەردگار ڕێنموونیم بکە بۆی).

**الدليل** سیفەتێکی لە سیفەتەکانی الله **تعالی** بەڵام ناوی الله **تعالی** نیە

بە (**الدلیل**) و (**الدَّلالة**) تەعبیری لێ دەکرێ، الدلیل وەک الهادي وایە، الدلالة وەک الهدایة وایە، بەڵام ناو و سیفەتەکانی الله ئەگەرچی لەماناشدا لەیەکتر زۆر نزیک بن ئەوا هەر یەکێکیان مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە، هیچ کامیان جێگرەوەی ئەوی تر نابێت بەتەواوی، وەک سیفەتەکانی (**الغضب و السخط و الغیظ**) کە لەمانادا لەیەکتر نزیکن بەڵام هەر یەکێکیان سیفەتێکن بۆ الله **تعالی**.

## سیفەتی ﴿المسح باليد﴾

(واتا: دەست پێداهێنان)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مَسَحَ ظَهْرَهُ، فَسَقَطَ مِنْ ظَهْرِهِ كُلُّ نَسَمَةٍ هُوَ خَالِقُهَا مِنْ ذُرِّيَّتِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ...).

**[جامع الترمذي : ٣٠٧٦]**

**قال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح**

واتا:

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێک الله ئادەمی دروستکرد دەستی هێنا بە پشتی ئادەم، جا لە پشتی ئادەم هەموو ئەو روح لەبەرانە کەوتنە خوارەوە کە الله دروستی دەکات لە نەوەی ئادەم تاکو ڕۆژی قیامەت).

**ابن القيم** رحمه الله دەڵێ:

ووشەی دەست لە قورئان و سوننەت و ووتەی هاوەڵان و تابعین زیاتر لە ١٠٠ جار هاتووە بەهاتنی جۆراوجۆر، لەپاڵیەوە شتی تر هاتووە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەمە دەستێکی حەقیقیە، بە گرتن و پێچانەوە و داخستن و کرانەوە و دەست پێداهێنان بە پشتی ئادەم هاتووە.

**[مختصر الصواعق المرسلة : ٢/١٧١]**

## سیفەتی ﴿الصبر﴾

**بەڵگە لە فەرموودە:**

عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أَحَدٌ أَصْبَرُ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللَّهِ، يَدَّعُونَ لَهُ الْوَلَدَ ثُمَّ يُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ).

**[صحيح البخاري : ٧٣٧٨]**

**[صحيح مسلم : ٢٨٠٤]**

واتا:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ کەسێک کە ناخۆشیەکی بیستبێ لە الله زیاتر ئارامی لەسەر نەگرتووە، بانگەشەی ئەوەی بۆ ئەکەن کە کوڕی هەیە کەچی سەلامەتیان دەکات و رزقیان دەدات).

**الخطابي** دەڵێ:

مانای الصبور لە سیفەتی الله **سبحانه وتعالى** نزیکە لە مانای الحلیم، تەنها جیاوازییان ئەوەیە کە بەندەکان ئەمین نابن لە سزا لە سیفەتی الصبور هەروەک ئەمین دەبن لە سزا لە سیفەتی الحلیم.

**[شأن الدعاء : ٩٨]**

**ابن القيم** دەڵێ:

الحلم لە سیفەتی الله دا فراوانترە لە الصبر.

**[عدة الصابرين: ٤٠٨]**

ووتم: هەندێک زانا (الصبور) بە ناوێک لە ناوەکانی الله هەژمار دەکەن، هیچ ئایەتێک و فەرموودەیەکی صەحیحم نەدیوە لەم بارەیەوە تەنها فەرموودەکەی الترمذي نەبێت کە ٩٩ ناوەکە ئەژمێرێ ئەویش فەرموودەیەکی زەعیفە.

## سیفەتی ﴿الحجزة و الحقو﴾

(هەردووکیان واتا: کەڵەکە)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (إِنَّ الرَّحِمَ شِجْنَةٌ آخِذَةٌ بِحُجْزَةِ الرَّحْمَنِ، يَصِلُ مَنْ وَصَلَهَا، وَيَقْطَعُ مَنْ قَطَعَهَا).

**[مسند أحمد : ٢٩٥٣] حديث صحيح**

واتا:

رەحم لقێکە لەناوی رەحمانی الله بۆتەوە، هەروەک لە ریوایەتی تردا هاتووە لەلای البخاري و الترمذي بە (شُجنة من الرحمن) پیتی (ش) بە زەممە و کەسرە هەردووکی دروستە، رەحم خۆی گرتووە بە کەڵەکەی الرحمن واتا الله، الله ئەو کەسە دەگەیەنێ کە صیلەی رەحم بگەیەنێ، وە ئەو کەسە دەپچڕێنێ کە صیلەی رەحم بپچڕێنێ).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتِ الرَّحِمُ، فَأَخَذَتْ بِحَقْوِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ لَهُ : مَهْ ؟ قَالَتْ : هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ. قَالَ : أَلَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ ؟ قَالَتْ : بَلَى يَا رَبِّ).

**[صحيح البخاري : ٤٨٣٠]**

واتا:

الله مەخلوقاتی دروست کرد کاتێک تەواو بوو لە دروست کردنی، رەحم هەڵسایەوە خۆی گرت بە کەڵەکەی الرحمن واتا الله، الله فەرمووی: دەست هەڵگرە، رەحم ووتی: ئەمە شوێنی ئەو کەسانەیە کە پانەت پێ دەگرن لە پچڕاندنی رەحم، الله فەرمووی: ئایا رازی نابیت ئەو کەسە بگەیەنم کە تۆ دەگەیەنێ، وە ئەو کەسە بپچڕێنم کە تۆ دەپچڕێنێ ؟ رەحم ووتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم.

شوێنی بەستنی پشتێنە یان قایش، لە مرۆڤدا پێی ئەووترێ: ناوقەد یان کەمەرە، بەڵام بۆیە لە کوردیەی ووشەی ناوقەد یان کەمەرەم بەکار نەهێنا چونکە ناوقەد واتا ناوەڕاستی باڵای مرۆڤ کەمەرەش بەهەمان شێوە هەروەک هێڵی استوائی بە هێڵی کەمەرەیی ناو ئەبەن بە حیساب کەوتۆتە ناوەڕاستی زەوی، بۆیە خۆم پاراست لەم دوو ووشەیە لەبڕی ئەوان کەڵەکەم بەکار هێنا کە ئەویش هەمان مانایە، هەندێک ووشەی عەرەبی هەیە کاتێک ئەیکەی بە کوردی بۆ زاتی الله ناگونجێ، بۆ نموونە: الفرح واتا دڵخۆشی، ووشەی دڵخۆشی بۆ مرۆڤ بەکاردێت، بەڵام کە الله سیفەتی الفرح-ی هەیە ناتوانین بە کوردی بیکەین بە دڵخۆشی، وە هیچ ووشەیەکی کوردی گونجاوم نەدۆزیوەتەوە لەبڕی الفرح کە بۆ الله بەکاربێت، ئەگەرچی ناوقەد و کەمەرە و کەڵەکە هەر سێکیان هەمان شتن بەڵام ئەوەی سێیەمیانم بەلاوە گونجاوتر بوو حەسەب ووشە کوردیەکە ئەگینا هەمووی یەک مانایە، نەک وابزانن ئەمە تەئویلە بەڵکو تەنها خۆپاراستنە لە لەفزە کوردیەکە کە حەسەب جسمی ئینسان دانراوە هاوشێوەی دڵخۆشیەکە.

ئەم سیفەتەش ئەهلی سوننە ئیسباتی دەکەن بۆ الله **تعالى** بەجۆرێک کە لایەق بێت بە زاتی بەرز و پاکی، بەبێ لێکچواندن و تەئویل کردن و نەفیکردن و لێکدانەوەی چۆنیەتیەکەی لە مێشکماندا.

**أبو بكر المروزي** دەڵێ:

کتێبێکم بەسەر ئیمام احمد خوێندەوە تا گەیشتم بە فەرموودەکەی أبو هريرة (رەحم خۆی گرت بە کەڵەکەی الرحمن) فەرموودەناسێک سەری بەرز کردەوە ووتی: ئەترسم کافر بوو بیت ! ئیمام احمد ووتی: ئەمە جەهمیە.

**[إبطال التأويلات لأبي يعلى : ٢١٤]**

**أبو طالب** دەڵێ:

بیستم پرسیار لە ئیمام احمد کرا هشام بن عمار کاتێک ئەم فەرموودەیان بەسەری خوێندۆتەوە وتوویەتی: ئەترسم کافر بوو بیت ! ئیمام احمد ووتی: هشام شامیە چی داوە لەم شتانە ؟!

**أبو طالب** دەڵێ: پێم ووت تۆ چی ئەڵێی ؟

ووتی: فەرموودەکە دەڕوێنین هەروەک چۆن هاتووە

**[إبطال التأويلات لأبي يعلى : ٢١٤]**

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی تەفسیری ئەم فەرموودەیە، ووتی: الزهري ئەڵێ: لەسەر پێغەمبەر گەیاندنە، لەسەر ئێمەش تەسلیم بوونە، باوکم ووتی: فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بڕوێنن هەروەک چۆن هاتووە.

**[العلل : ٢/٢٠٧]**

## سیفەتی ﴿الكف﴾

(واتا: ناوەوەی دەست یان لەپی دەست)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

(مَا تَصَدَّقَ أَحَدٌ بِصَدَقَةٍ مِنْ طَيِّبٍ، وَلَا يَقْبَلُ اللَّهُ إِلَّا الطَّيِّبَ، إِلَّا أَخَذَهَا الرَّحْمَنُ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ كَانَتْ تَمْرَةً، فَتَرْبُو فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ حَتَّى تَكُونَ أَعْظَمَ مِنَ الْجَبَلِ، كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ أَوْ فَصِيلَهُ).

**[صحيح مسلم : ١٠١٤]**

واتا:

(هیچ کەسێک سەدەقەی نەکردووە لە ماڵێکی پاک و حەلالدا -وە الله پاک نەبێت وەری ناگرێت – ئەوا ئیللا الرحمن بە دەستی ڕاستی وەری دەگرێت ئەگەرچی دەنکە خورمایەکیش بێت، جا لە ناو دەستی یان لەپی الرحمن گەشە دەکات سەدەقەکە تاکو لە چیا گەورەتر دەبێت، هەروەک چۆن یەکێک لە ئێوە بەچکەی ئەسپەکەی گەورە دەکات یان بەچکەی حوشترەکەی کە لە شیر بۆتەوە و لەدایکی دابڕاوە).

# سیفەتی ﴿الأسف﴾

(بە مانای تورە بوون دێت)

## بەڵگە لە قورئان:

**قال الله تعالى: ﴿فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ [الزخرف: ٥٥]**

واتا:

کاتێک تورەیان کردین بە بەردەوام بوونیان لەسەر کوفر ئەوا تۆڵەمان لێکردنەوە و هەموویانمان نقوم کرد.

(واتا: فیرعەون و قەومەکەی).

**ابن قتيبة** دەڵێ:

**فلما ءاسفونا**، أي: أَغْضَبُونا

**والأَسَفُ**: الغَضَبُ

يقال: **أَسِفْتُ آسَفُ أَسَفاً**، أي: غَضِبْتُ.

**فلما ءاسفونا** واتا: کاتێ تورەیان کردین.

**والأَسَفُ** واتا: تورەیی.

**أَسِفْتُ آسَفُ أَسَفاً** واتا: توورەبووم.

**[تفسير غريب القرآن : ٣٩٩]**

**الطبري** له تەفسیری ئەم ئایەتەدا هەمان مانای تورە بوون نەقل دەکات له **ابن عباس** و **مجاهد** و **قتادة** و **السدي** و **عبدالرحمن بن زيد بن أسلم**.

**ابن تيمية** له (العقيدة الواسطية) ئەم ئایەتەی کردۆتە بەڵگە بۆ ئیسبات کردنی سیفەتی (الأسف) بۆ الله تعالى.

**محمد خليل الهراس** دەڵێ:

**الأسف**: بەکاردێت بە مانای توندی خەم، وە بە مانای توندی تورەیی دێت، لەم ئایەتەشدا مەبەست پێی ئەوەی دووەمە.

**[شرح الواسطية : ١١١]**

## سیفەتی ﴿الكنف﴾

(واتا: داپۆشین، ستر)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَدْنُو أَحَدُكُمْ مِنْ رَبِّهِ حَتَّى يَضَعَ كَنَفَهُ عَلَيْهِ ...) الحديث.

**[صحيح البخاري : ٧٥١٤]**

**[صحيح مسلم : ٢٧٦٨]**

واتا:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر یەکێک لە ئێوە نزیک دەبێتەوە لە پەروەردگاری تاکو ستری خۆی دەدات بەسەریدا).

مەبەست پێی لەکاتی حیسابی ڕۆژی قیامەتە.

**البخاري** دەڵێ:

**عبدالله بن المبارك** دەڵێ: كنفه يعني ستره.

کەنەفی الله واتا ستری الله.

**[خلق أفعال العباد:١٠٣]**

**أبو موسى المديني** دەڵێ:

(**حتى يضع عليه كنفه**) أي: يستره.

واتا: ستری دەکات.

**[المجموع المغيث: ٣/٧٨]**

**عبدالله الغنيمان** دەڵێ:

(حتى يضع كنفه عليه) **الكَنَف** تەفسیر کراوە لە فەرموودەکەدا بە مانای ستر، واتا: **الله تعالى** بەندەکەی ستر دەکات لەوەی کە خەڵکی ببینن تاکو ریسوا و شەرمەزار نەبێ لە بەرامبەریان چونکە لە کاتی پرسیار و دان پێدانان بە تاوانەکانی حاڵی ئەگۆڕێ و ترسێکی زۆر لەسەر ڕووی دەرئەکەوێ.

**[شرح كتاب التوحيد من صحيح البخاري : ٢/٤٢٣]**

## سیفەتی ﴿الحفي﴾

(واتا: چاکەکار)

**بەڵگە لە قورئان:**

قال الله تعالى: ﴿قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا﴾ [مريم: ٤٧]

واتا:

پێغەمبەر إبراهيم عليه السلام بە باوکی ووت: لەلایەن منەوە سەلامەت لێبێ کە سەلامەت ئەبیت لێم، داوای لێخۆشبوون و هیدایەتت بۆ ئەکەم لای پەروەردگارم، بەڕاستی پەروەردگارم زۆر چاکەکارە لەگەڵم.

**ابن قتيبة** لە (تفسير غريب القرآن) دەڵێ:

**حفياً**: أي بارا، عودني منه الإجابة إذا دعوته.

**حفياً**: واتا چاکەکار، وەڵامی دوعاکانم ئەداتەوە کاتێک داوای لێئەکەم.

**الراغب الأصبهاني** دەڵێ:

**الحفي**: واتا البر اللطيف.

**[المفردات: ٢٤٦]**

**البر**: چاکەیە، وەک ئەووترێ (بر الوالدين) چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک.

**اللطيف**: بە دوو مانا دێت، یەکێکیان بەمانای شتی شاراوە و وورد دێت، واتا الله زانا و ئاگادارە بە شتە شاراوە و ووردەکان، کە لێرەدا ئەم مانایە لەخۆ ناگرێت، کاتێک ناوی اللطيف لەپاڵ ناوی الخبير دێت ئەم مانایە ئەدات،

ماناکەی تر واتا: تلطف هەروەک لە کوردیدا دەووترێ: لوطف، بە تەواوی مانا کوردیەکەی نازانم چ ووشەیەک دەربڕم بەڵام بەشێوەیەکی گشتی چۆن ئەڵێی: بەزەیی بە بەندەکەی دێتەوە و نیعمەتی پێدەبەخشێ و یارمەتی دەدات کە ئەمەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ مانای چاکەکردن.

**ابن العربي** دەڵێ:

**التحفي**: غاية البر.

واتا: ئەوپەڕی چاکەکاری.

**[الأمد الأقصى : ٢/١٣٢]**

## سیفەتی ﴿الحثو﴾

(واتا: چنگ)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

عن أبي أمامة الباهلي عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (وَعَدَنِي رَبِّي أَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلَا عَذَابٍ، مَعَ كُلِّ أَلْفٍ سَبْعِينَ أَلْفًا، وَثَلَاثَ حَثَيَاتٍ مِنْ حَثَيَاتِ رَبِّي).

**[مسند أحمد: ٢٢٣٠٣] واللفظ له**

**[جامع الترمذي: ٢٤٣٧]**

**[سنن ابن ماجه: ٤٢٨٦]**

**حديث حسن**

**حسنه ابن حجروالوادعي**

وقال **الذهبي**: إسناده قوي

وقال **ابن كثير**: إسناده جيد

واتا:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پەروەردگارم بەڵێنی پێدام ٧٠ هەزار کەس لە ئوممەتەکەم بخاتە بەهەشتەوە بەبێ حیساب، لەگەڵ هەر هەزار کەسێکیان ٧٠ هەزار کەسی تر ئەچنە بەهەشتەوە، وە ٣ چنگ لە چنگی پەروەردگارم).

**چنگ:** هەردوو دەستی مرۆڤ بە نیمچە کراوەیی بەیەکەوە بلکێنی ئەبێتە چنگێک، بۆ نموونە کەسێک هەردوو دەستی ئەخاتە ناو برنجەوە لێی دەرئەهێنێ، ئەمە ئەبێتە چنگێک برنج، گەر یەک دەستیش بێت بە داخراوی ئەبێتە مشتێک برنج، جا الله **تعالى** بە دوو دەستەکانی خۆی کە لایەقە بەزاتی بەرز و پاکی ٣ چنگ لە ئوممەتی

ئیسلام هەڵئەگرێت و ئەیانخاتە بەهەشتەوە بەبێ حیساب، جگە لە ٧٠ هەزارەکە کە هەر هەزارێکیان ٧٠ هەزاری تری لەگەڵدایە.

# سیفەتی ﴿الوعي﴾

(واتا: گلّدانەوە)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَنَّهَا جَاءَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: (يَا نَبِيَّ اللَّهِ، لَيْسَ لِي شَيْءٌ إِلَّا مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ الزُّبَيْرُ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ أَرْضَخَ مِمَّا يُدْخِلُ عَلَيَّ، فَقَالَ: (ارْضَخِي مَا اسْتَطَعْتِ، وَلَا تُوعِي ، فَيُوعِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ).

**[صحيح البخاري: ١٤٣٤]**

**[صحيح مسلم: ١٠٢٩] واللفظ له**

واتا:

أسماء کچی أبو بکر ڕەزای الله لەخۆیی و باوکی بێت هات بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ووتی: ئەی پێغەمبەری الله من هیچ شتێکم نیە جگە لەوە نەبێت کە الزبیر-ی مێردم پێمی ئەدات، ئایا گوناهم ئەگات گەر شتێک لەوە ببەخشم کە الزبیر پێمی ئەدات ؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ببەخشە بەپێی توانا، وە گلّی مەدەرەوە الله لێتی گلّ ئەداتەوە).

بۆیە لە زمانی عەرەبی دەفر و جام و شتەکانی تری هاوشێوە کە خۆراکی تێدا دائەنرێ پێی ئەووترێ: (الوعاء) چونکە خۆراکەکە یان ئەو شتەی کە تێی ئەکرێ گلّی ئەداتەوە.

**ابن حجر العسقلاني** دەڵێ:

گلّدانەوە کە دراوەتە پاڵ الله شتێکی مەجازە مەبەست پێی گرتنەوەی بەخشینە.

**فتح الباري: [٣/٣٠]**

**ابن باز** لە تەعلیقاتی لەسەر فتح الباري دەڵێ:

ئەم ووتەیەی ابن حجر هەڵەیە، صەواب ئیسبات کردنی ئەم سیفەتەیە بۆ اللّٰه لەسەر شێوەیەک کە لایەق بێت بە زاتی پاک و بەرزی وەک باقی سیفەتەکانی تر.

## سیفەتی ﴿المباهاة﴾

(واتا: شانازی کردن)

**بەڵگە لە فەرمووده:**

عن معاوية بن أبي سفيان رضي الله عنهما: (... وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: مَا أَجْلَسَكُمْ ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِلْإِسْلَامِ، وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا، قَالَ: آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلَّا ذَاكَ ؟ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلَّا ذَاكَ، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلَائِكَةَ).

**[صحيح مسلم : ٢٧٠١]**

واتا:

(پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هاتە دەرەوە بۆ ژمارەیەک لە هاوەڵانی کە بازنەیەکیان دروست کردبوو، فەرمووی: چ شتێک ئێوەی دانیشاندووە ؟ ووتیان: دانیشتووین زیکری الله دەکەین و سوپاسی دەکەین لەسەر ئەوەی کە هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام و منەتی کرد بەمە بەسەرمان، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: سوێندتان ئەدەم بە الله هیچ شتێک ئێوەی دانەنیشاندووە تەنها ئەمە نەبێت ؟ ووتیان: والله داینەنیشاندووین تەنها ئەمە نەبێت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: من بۆ ئەوە سوێندم نەدان کە بڕواتان پێ نەکەم، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە جبریل هاتە لام پێی ڕاگەیاندم کە الله **عز وجل** شانازیتان پێوە ئەکات لەلای فریشتەکان).

**الفضيل بن عياض** رحمه الله دەڵێ:

هەموو ئەم سیفەتانە دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا و پێکەنین و شانازی کردن و دەرکەوتن لە بەرزییەوە، چۆنی بوێت دائەبەزێ، وە چۆنی بوێت شانازی ئەکات، وە چۆنی بوێت لە بەرزییەوە دەرئەکەوێ، وە چۆنی بوێت پێئەکەنێ، ئێمە بۆمان نیە بیری لێ بکەینەوە کە چۆن چۆنیە، وە ئەگەر جەهمیەک پێی ووتی: من بڕوام نیە بە

پەروەردگارێک کە لە شوێنی خۆی دابەزێ، تۆش بڵێ: من بڕوام هەیە بە پەروەردگارێک کە هەر شتێکی بوێت ئەیکات.

**ابن تیمیة نەقلی کردووە لە [درء تعارض العقل والنقل: ٢/٢٤]**

**ابن القیم** دەڵێ:

الله عز وجل شانازی ئەکات لای فریشتەکانی بە بەندە زیکر کەرەکانی هەروەک لە صەحیحی مسلم ڕیوایەت کراوە.

**[الوابل الصیب: ١/٧٤]**

## سیفەتی

﴿الكلام: ووتە﴾

﴿القول: ووتە﴾

﴿الحديث: ووتە﴾

﴿النداء: بانگ كردن﴾

﴿الصوت: دەنگ﴾

﴿الحرف: پیت﴾

### بەڵگە لە قورئان:

قال الله تعالى: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ [النساء: ١٦٤]

قال الله تعالى: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ﴾ [التوبة: ٦]

قال الله تعالى: ﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ﴾ [المائدة: ١١٩]

قال الله تعالى: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾ [النساء: ١١٢]

قال الله تعالى: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا﴾ [النساء: ٨٧]

قال الله تعالى: ﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ [طه: ١١]

### بەڵگە لە فەرموودە:

عن عبدالله بن أنيس قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ – أَوْ قَالَ: الْعِبَادُ – عُرَاةً غُرْلًا بُهْمًا ". قَالَ: قُلْنَا: وَمَا بُهْمًا ؟ قَالَ: لَيْسَ مَعَهُمْ شَيْءٌ،

ثُمَّ يُنَادِيهِمْ بِصَوْتٍ يَسْمَعُهُ مَنْ بَعُدَ كَمَا يَسْمَعُهُ مَنْ قَرُبَ: أَنَا الْمَلِكُ، أَنَا الدَّيَّانُ ...) الحديث.

**[مسند أحمد: ١٦٠٤٢] حديث حسن**

واتا:

## عبدالله بن أنيس دەڵێ:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی بێ جل و بەرگ و بوهمی لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، وتیان: بوهم چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟

لە وەڵامدا فەرمووی: واتە هیچیان پێ نییە، دواتر دەنگێك بانگیان دەکات، ئەوەی لە دوورە بە ئەندازەی ئەو کەسە گوێی لێ دەبێ کە نزیکە، دواتر ئەو دەنگە دەڵێ: من پاشا و مەلیکم، من پاداشت دەرەوەی بەندەکانم).

عَنِ ابن عباس قَالَ:

(بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَقَالَ: هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الْأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَسَلَّمَ، وَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلَّا أُعْطِيتَهُ).

**[صحيح مسلم : ٨٠٦]**

## ابن عباس رضي الله عنه دەڵێ:

ڕۆژێك جبریل علیه السلام لای پێغەمبەر صل الله علیه وسلم دانیشتبوو گوێی لە دەنگێك بوو لە سەرەوە واتە لە ئاسمانەوە، جبریل سەری بەرز کردەوە و وتی: ئەمە دەرگای ئاسمانی دونیایە ئەمڕۆ کرایەوە، پێشتر هەرگیز نەکراوەتەوە، دواتر لە ئاسمانەوە فریشتەیەك دابەزی، جبریل وتی: ئەم فریشتەیە کە ئەمڕۆ دابەزی پێشتر هەرگیز دانەبەزی بوو، دواتر ئەم فریشتەیە سەلامی کرد و وتی: موژدەت لێبێ ئەی محمد بە دوو ڕووناکی کە پێشتر نەدراوە بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش خۆت، ئەویش فاتیحەی قورئان و کۆتاییەکانی سورەتی بەقەرەیە، هیچ پیتێکی لێ ناخوێنیتەوە لەوانە مەگەر من لەو نورە پێی نەبەخشم.

## سیفەتی ﴿البشاشة﴾

**بەڵگە لە فەرموودە:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا تَوَطَّنَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ الْمَسَاجِدَ لِلصَّلَاةِ وَالذِّكْرِ إِلَّا تَبَشْبَشَ اللَّهُ لَهُ كَمَا يَتَبَشْبَشُ أَهْلُ الْغَائِبِ بِغَائِبِهِمْ إِذَا قَدِمَ عَلَيْهِمْ).

**[مسند أحمد: ٨٣٥٠]**

**[سنن ابن ماجه: ٨٠٠] واللفظ له**

**حديث صحيح**

واتا:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ پیاوێکی موسڵمان پابەندی مزگەوت نابێت بۆ نوێژ کردن و زیکر کردن ئیللا الله ڕووی پێ ئەکرێتەوە و ئەگەشێتەوە هەروەک چۆن کەسێکی ڕۆیشتوو ئەگەڕێتەوە کەس و کارەکەی ڕوویان پێی ئەکرێتەوە و ئەگەشێتەوە بە هاتنەوەی).

البشاشة یان البشبشة:

واتا ڕوو کرانەوە و گەشانەوە، پێچەوانەی ڕوو گرژییە، کاتێک کەسێکی خۆشەویست ئەبینیت بە ڕووێکی کراوە و گەشاوە و دەم بە خەندەوە پێشوازی لێ ئەکەیت، کەسی بەرامبەر هەست بە دڵخۆشیت ئەکات لە بینینی ڕووی تۆ.

**ابن قتيبة** دەڵێ:

قوله: (يتبشبش) من البشاشة.

**[غريب الحديث: ١/١٦٠]**

**أبو يعلى الفراء** دەربارەی ووتەکەی **ابن قتيبة** دەڵێ:

فەرموودەکەی لەسەر ڕووکەش (ظاهر) وەرگرت و تەئویلی نەکرد.

**[إبطال التأويلات: ١/٢٤٣]**

هەروەها **أبو يعلى** دوای ئیسبات کردنی سیفەتی (**الفرح**) دەڵێ:

هەمان شت ئەڵێین دەربارەی سیفەتی (البشبشة) چونکە ماناکەی نزیکە لە مانای (الفرح)، عەرەب ئەڵێ: (رأيتُ لفلانٍ بَشاشةً وهَشاشةً وفَرَحاً) وە ئەڵێن: (فلانٌ هَشٌّ بَشٌّ فَرِحٌ) کاتێک ڕووی کراوە بێ، جا دروستە سیفەتی (البشبشة) بووترێ دەربارەی هەروەک چۆن دروستە سیفەتی (الفرح) بووترێ دەربارەی.

## سیفەتی ﴿الروح﴾

(بە مانای رەحمەت دێت)

**بەڵگە لە قورئان:**

قال الله تعالى: ﴿وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ [يوسف: ٨٧]

واتا:

(بێ هیوا مەبن لە رەحمەت و فەرەجی الله، هیچ کەسێک لە رەحمەتی الله بێ هیوا نابێت تەنها کافران نەبن).

**الطبري** دەڵێ:

رَوْح الله واتا: فەرەج و رەحمەتی الله.

ئینجا **الطبري** ئەم تەفسیرانەی خوارەوە نەقل ئەکات:

**قتادة** دەڵێ:

رَوْح الله واتا: رەحمەتی الله.

**السدي** دەڵێ:

رَوْح الله واتا: فەرەجی الله.

**الضحاك** دەڵێ:

رَوْح الله واتا: رەحمەتی الله.

**ابن إسحاق** دەڵێ:

رَوْح الله واتا: فەرەجی الله.

**عبدالرحمن بن زيد بن أسلم** دەڵێ:

رَوْح الله واتا: فەرەجی الله.

فەرەج و رەحمەت ماناکانیان لەیەکتر نزیکە، فەرەج: واتا ڕزگار کردنی بەندەکانی لە ناخۆشی و لابردنی ناخۆشی لەسەریان، کە ئەمەش هەر بەرهەمی رەحمەتی الله یە.

**بەڵگە لە فەرموودە:**

سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الرِّيحُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ). عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ:

**[مسند أحمد : ٧٦٣١]**

**[سنن أبي داود : ٥٠٩٧] واللفظ له**

**[سنن ابن ماجه : ٣٧٢٧] حديث حسن**

واتا:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (با لە رەحمەتی الله یە).

**ابن الأثير** دەڵێ:

(**الريح من رَوْح الله**) أي: من رحمته بعباده.

واتا: با لە رەحمەتی الله یە بە بەندەکانی.

**[النهاية في غريب الحديث والأثر: ٢/٢٧٢]**

**شمس الحق العظيم آبادي** دەڵێ:

(الريح من رَوْح الله) گەر پیتی (ر) فەتحەی بەسەرەوە بێت بە مانای رەحمەت دێت، هەروەک لە ئایەتی: ﴿وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ هاتووە.

**[عون المعبود: ١٤/٣]**

**أحمد شاكر** دەڵێ:

(مِنْ رَوْح الله) بە (ر) فەتحە لەسەر و (و) سکوندار، واتا: رەحمەتی الله یە بە بەندەکانی.

**[شرح المسند : ١٣/١٤٤]**

## سیفەتی ﴿العتاب﴾

(واتا: لۆمە کردن)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

عَنْ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَامَ مُوسَى النَّبِيُّ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ فَسُئِلَ أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ ؟ فَقَالَ: أَنَا أَعْلَمُ، فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ ...) الحديث.

**[صحيح البخاري: ١٢٢]**

**[صحيح مسلم: ٢٣٨٠]**

واتا:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پێغەمبەر موسی ووتاریدا لەناو بەنی ئیسرائیل، پرسیاری لێکرا کام کەس لە خەڵکی زاناترینە ؟ موسی ووتی: من زاناترینی خەڵکم، جا الله لۆمەی ئەم کارەی کرد چونکە زانینی ئەمەی بۆ الله نەگەڕاندەوە).

واتا لە وەڵامدانەوەکەی نەیووت: الله أعلم.

## سیفەتی ﴿الاستواء﴾

(واتا: بەرزبوونەوە و جێگیربوون)

**بەڵگە لە قورئان:**

قال الله تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ [طه: ٥]

قال الله تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ [الأعراف: ٥٤]، [يونس: ٣]، [الرعد: ٢]، [الفرقان: ٥٩]، [السجدة: ٤]، [الحديد: ٤]

واتا:

الله **تعالى** کە (الرحمان)ە، بەرزبووەوە و جێگیر بوو لەسەر عەرشەکەی، بەرزبوونەوەیەک کە لایەقە بەزاتی خۆی، شایەن و گونجاوە بەخۆی، کە هیچی لە دروستکراوەکان ناچێت، سبحان وتعالی.

**بەڵگە لە فەرموودە:**

عن أنس بن مالك رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وهو اليوم الذي استوىٰ فيه ربكم على العرش) أي: يوم الجمعة.

**[الشافعي في مسنده: ٧٠]**

**[عبدالله بن الإمام أحمد في السنة: ٥٦]**

واتا:

**أنس بن مالك** رضي الله عنه دەڵێ:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕۆژی جومعە ئەو ڕۆژە بوو کە پەروەردگارتان لەسەر عەرشەکەی بەرزبووەوە و جێگیربوو).

عن قتادة بن النعمان رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (لَمَّا فَرَغَ اللَّهُ مِنْ خَلْقِهِ اسْتَوَى عَلَى عَرْشِهِ) **وهو حديث صحيح.**

**[إسناده صحيح على شرط البخاري]**

**[الخلال في كتاب السنة]**

**[الذهبي في كتاب العرش]**

واتا:

**قتادة بن النعمان** رضي الله عنه دەڵێ:

بیستم پێغەمبەری الله صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو:

(کاتێ الله لە دروستکردنی دروستکراوەکان بووەوە، جێگیربوو و بەرزبووەوە لەسەر عەرشەکەی).

پرسیاری ئیستواء لە ئیمامی مالیک کرا **رضي الله عنه** ئەویش فەرمووی: ئیستواء زانراوە، چونکە لەقورئاندا باسکراوە، هەروەها چۆنیەتیەکەی نەزانراوە چونکە باسنەکراوە، ئیمان هێنان پێی واجبە، چونکە ئایەتی قورئانی پیرۆزە، پرسیارکردنیش دەربارەی چۆنیەتی بەرزبوونەوە و جێگیربوونی بیدعەیە، چونکە هاوەڵان ئەو پرسیارەیان نەکردووە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

**[كتاب العرش للذهبي: ١/١٦٨]**

**ابو عبيدة** لەمانای (**استوى**) دەڵێ:

واتا: بەرزبووەوە.

**[العرش للذهبي]**

**أبو حاتم الرازي** دەڵێ:

استوى واتە: بڵند و بەرزبووەوە

**[تفسير ابن أبي حاتم الرازي]**

استواء به واتای (العلو - الارتفاع - الاستقرار - الصعود) دێت، واتا بەرزبوونەوە و جێگربوون.

**ابن القيم** دەڵێ:

ڕووکەشی (ئیستواء) و ڕاستییەکەی بەرزبوونەوە و بڵند بوونە، وەک ئەوەی هەموو زانایانی ئەهلی زمان و تەفسیر کۆکن لەسەری.

**[الصواعق المرسلة لابن القيم الجوزية]**

**ابن القيم** لە قەصیدەکەی خۆی (القصيدة النونية) دا دەڵێ:

فلهم عبارات عليها أربع ** قد حصلت للفارس الطعانِ.

وهي استقر وقد علا وكذلك ار ** تفع الذي ما فيه من نكران.

وكذاك قد صعد الذي هو رابع ** وأبو عبيدة صاحب الشيباني.

يختار هذا القول في تفسيره ** أدرى من الجهمي بالقرآن.

قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ

تم بحمد الله

